# سيحر وجادووگەری

خۆشەویستان لە بابەتی ئەمجارەماندا باسی یەكێكی تر لەتاوانە گەورەكان دەكەین، كە پێغەمبەری خوا ( درودی لەسەر بێت) بەیەكێك لەو تاوان و گوناهانەی ژماردووە كە دەبنە هۆی لەناوچوونی ئومەتی ئیسلام، ئەویش سیحر وجادوگەرییە .

( السحر ) واتە: جادوو، لەزمانی عەرەبیدا بریتیە لەوون بوون وشاردنەوە، نەمان وشاردنەوەی هۆی ئەنجامدانی كارێك لە ڕێی جادووەوە.

وەك خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿سَحَرُوٓاْ أَعۡيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسۡتَرۡهَبُوهُمۡ ﴾ [سورة الأعراف: 116]

واتە: هۆی ئەنجامدانی كارەكانیان ئەشاردەوە چاوبەستیان لە خەڵك ئەكرد وئەیان ترساندن بەكارەكانیان لە ڕێی جادووەوە، ( مەبەست جادوو گەرانی فیرعەونە ).

جادوو كارێكی نائاساییە ولەتوانای هەموو كەسێكدا نیە، جگە لەوانەی كە خاوەن نەفسێكی بەتكارن وبەجادوو كردن ڕاستیەكان لەبەرچاو خەڵك ئەگۆڕن وچاوبەستیان لێ دەكەن

وەبەفیکر وهۆشیان یاری دەکەن هەندێك جاریش تووشی زەرەر وزیان ودوژمنایەتی ولێك دوورخستنەوە وجیابوونەوەیان دەکەن.

بەڵام ئایا سیحر وجادووو بوونی هەیە وڕاستە....؟

زۆربەی زانایانی ئسلام پێیان وایە کە جادوو بوونی هەیە وڕاستە، چەندین دەقی قورئانی وفەرموودە وڕووداوی لە بارەیەوە هاتووە.

هەروەك ئیمامی نەوەوی دەڵێت: ڕاستیەکەی وایە کە سیحر وجادوو بوونی هەیە ولەلایەن کۆی زانایانەوە ( إجماع ) بڕاوەتەوە وبەشێوەیەکی گشتی کۆدەنگی زانایانی ئوممەتی ئیسلامی لەسەرە، بەو بەڵگانەی کەلە قورئان وسوننەتدا باسیان لێوە کراوە.

وە هەروەها کاریگەری وئاسەواری جادوو کردن ڕوون وئاشکرایە بەبێ ئەوەی کەکەس بزانێت جی بووە وئەوکارانە جۆن ڕوویان داوە.

زۆر جاریش بە فێڵ وتەڵەکە وبردنی هۆشی بینەر بەڕێوە دەبرێت کەلە ڕاسیەوە دوورە وهیچ هەقیقەتێکی نیە، کە جادووگەر هەڵئەسێت بە چاو بەست کردنی بینەر وەبە

تەڕدەستیەکی بەهێز هۆی ئەنجامدانی کارەکەی ئەشارێتەوە وڕاستیەکان لەبەرچاویان پێچەوانە دەکاتەوە.

ئیمامی ئەبو حنیفە ومەزهەبی موعتەزیلەش پێیان وایە کە سیحر وجادوو ڕاست نیە وەهەمووی فێڵ وتەڵەکەیە وهەقیقەتی نیە ودوورە لەڕاستیەوە.

ئایا کارکردن بەسیحر وجادوو دروستە.....؟!

بەکۆدەنگی زانایانی ئیسلام وبەو بەڵگانەی کەلەبەردەستماندایە وئاماژەیان پێدەکەین، کارکردن بەسیحر وجادوو، واتە: جادووو گەری یەکێکە لەتاوانە گەورەکان، بەڵکو هەندێك جار بێ بڕوای وکوفرە، ئەگەر هاتوو جۆرێك لەجۆرەکانی کوفر وبێ باوەڕی لەخۆ گرتبێت، وەك سوکایەتی کردن بەقورئانی پیرۆز کە زۆربەی هەرەزۆری جادوو گەران ئەم کارە دەکەن بەمەبەستی ڕازی کردنی شەیتان وشەیاتینیەکان وبەڕێوە چوونی کارەکانیان ، وەیاخود هەرجۆرێکی دیکە.

وە هەروەها فێر بوون وفێرکردنی سیحر وجادووش وەك کارپێکردنی وایە لەحەرامیدا وەئەچێتە نێو ئەم بازنەیەوە.

وەئەگەر هاتوو سیحر وجادوو کردن کوفر وبێباوەڕی لەخۆ نەگرتبێت، ئەوە خاوەنەکەی بەپێی یاسای ئاینی پیرۆزی

ئیسلام داوای تەوبەکردنی لێ دەکرێت، وگەربێت وتەوبەبکات وبەشیمان بێتەوە ئەوا تەوبەکەی لێ وەردەگیرێت، ئەمە بەپێی راو بۆچوونەکانی ئیمامی شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) بەڵام هەرسێ ئیمامی ئەبو حەنیفە ومالیك وئەحمەد ( ڕەزای خوایان لێ بێت ) پێیان وایە کە جادوو گەر هەرچۆن بێت کافر وبێباوەڕە وداوای تەوبەی لێ ناکرێت تەوبەشی لێ وەرناگیرێت بەڵکو پێویستە بکوژرێت....

لەلایەکی دیکەوە هەندێك لە زانایان پێیان وایە فێربوونی سیحر وجادوو ڕێپێدراوە بە دوو مەبەست

یەکەم: بەمەبەستی دەست کەوتنی زانیاری لەبارەی جۆرەکانی جادووەوە وەتائەوەی کوفر وبێباوەڕی لەخۆ گرتووە بناسرێتەوە لەوانی دیکە.

دووەم: بەمەبەستی زانین وتوانینی لابردن وپوچەڵکردنەوەی ئەوسیحر وجادووەی کەلەخەڵك کراوە.

بەومەرجەی کەنابێت بەهیچ شێوەیەك فێربوونی سیحر وجادوو کوفر وبێباوەڕی تێدابێت، وەیان بچوکترین زەرەر وزیانی بۆ عەقیدە وبیرو باوەڕی مرۆڤ هەبێت......

ئەو بەڵگەو دەلیلانەی کە ناڕەوایی سیحر وجادوو کردن وقەدەغەکردنی لە ئاینی پیرۆزی ئسلامدا ئەسەلمێنن زۆرن، لێرەدا ئێمەش ئامارژە بە هەندێکیان دەکەین، لەوانە:

خوای گەورە دەفەرموویێت : ﴿وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَنُ وَلَكِنَّ ٱلشَّيَطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ ﴾ [سورة البقرة : 102] واتە : سولەیمان بێباوەڕ نەبوو، بەڵکو شەیتانەکان بێباوەڕ بوون کە خەڵکیان فێری سیحر وجادوو کرد .

وەدفەرموویێت: ﴿وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَى ﴾ [ سورة طه : 69] واتە : جادووگەریش بۆ هەر کوێ بچێت و هەرچی بکات سەرکەتوو نابێت.

وە: ﴿أَفَتَأْتُونَ ٱلسِّحْرَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ﴾ [سورة الأنبياء: 3] واتە : ئایا ئێوە دێنەلای جادوو و دەسخەرۆی جادوودەبن و، لەحاڵێکا چاوتان هەیەو دەبینن ، واتە: ئەگەر پەیڕەوی لێ بکەن، وەك ئەوە یەپەیڕەویتان لەسیحر کردبێت .

وەدەفەرموویێت: ﴿فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴾ [سورة طه : 66] واتە : بەڵێ.. ئەوان دەستپێشخەرییان کرد، جا پەت و گوریس و گۆچانەکانیان هەڵدایە گۆڕەپانی جادووەکەوە ئەوەندە سەر سوڕهێنەر بوو مووسا وا گومانی برد لە

جادووەکەیان  پەتەکان و عەساکانیان ئەجوولێنەوەو دێن و دەچن وەك (مار)ێکی گەورە

وە: ﴿وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِي ٱلۡعُقَدِ ﴾ [سورة الفلق : 4] واتە : ئەی خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لەو کەسانەی کە پەت گرێ دەدەن و فووی پێدا دەکەن .

هەروەها لەچەندین فەرموودەی ڕاستیشدا، پێغەمبەر  (درودی خوای لەسەر بێت)، ئامازەی بەبوون وڕاستی سیحر وجادووکردن کردووە وبەیەکێك لەتاوانە گەورەکان وهاوشانی هاوبەش بڕیاردان بۆ خوای گەورە ناوزەد کردووە، لەوانە ئەم فەرمووودە سەحیحەی کە باسی دەکەین وئەو ڕووداوە گرنگەش کە لە ژیانی پێغەمبەری نازداردا ( درودی خوای لەسەر بێت ) ڕوویدا، کەلەلایەن  ( لەبیدی کوڕی ئەعسەمی ) یەهودیەوە جادووی لێ کراو پاشان خوای گەورە لە ڕێی فریشتەکانیەوە، لە چۆنیەتی جادوو کردنەکە ئاگاداری کردەوە وشیفای بەخێری بۆ نارد وجادووەکەشی پوچەڵ کردەوە، هەروەك لە دایکی بڕوادارانەوە ( عائیشە ) ( ڕەزای خوای لێ بێت ) ئەگێڕنەوە، کە ئەفەرمووێت: « سحر رسول الله صلى الله عليه وسلم، يهودى من يهود بنى زريق يقال له لبيد بن ا لعصام، قالت: حتى كان رسول الله ﴿صلى الله عليه وسلم ) يخيل إليه أنه يفعل الشئ وما يفعل، حتى إذا كان ذات يوم أو ذات ليل ة دعا رسول الله ﴿صلى الله عليه وسلم ) ثم دعا ثم دعا ، ثم قال: ﴿ يا عائشة أشعرت أن الله

أفتاني فيما استفتيته فيه؟ جاءني رجلان فجلس أحدهما عند رأسي والآخر عند رجلي، ثم قال أحدهما لصاحبه: ما وجع الرجل؟ قال: مطبوب، قال: من طبه؟ قال لبيد بن الأعصم، قال: في آي شيئ؟ قال في مشط ومشاطه ، قال: وجب طلعة ذكر، قال: فأين هو؟ قال: في بئر ذي أروان ) قالت: فأتاها رسول الله صلى عليه وسلم في أناس من أصحابه ثم قال: ﴿ يا عائشة والله لكأن ماءها نقاعة الحناء ولكأن نخلها رؤوس الشياطين ) قالت: فقلت يا رسول الله أفلا أحرقته؟ قال: لا ، أما أنا فقد عافان الله وكرهت أن أثير على الناس شرا ، فأمرت بها فدفنت » . [رواه البخاري 5433 ومسلم 2189 وغيرهما]

بە پێی ئەو بەڵگەو دەلیلانەی سەرەوە کە باسمان کرد لە دەقەکانی قورئانی پیرۆز وفەرموودە ڕاستەکانی پێغەمبەری ئازیز (درودی خوای لەسەر بێت) وڕاوبۆچوونی زانایانی ئیسلام، ماوەتەوە بڵێین: کە ڕای هەرسێ پێشەوای ئیسلام ( ئەبو حەنیفە ومالیك وأحمد ) (ڕەزای خوایان لێ بێت ) سەبارەت بە بێباوەڕ دانانی جادووگەر حەرام ونارەوایی جادوو کردن، ڕاستر ولەپێشترە لەڕای پێشەوا (شافیعی ) ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) لەوبارەیەوە.

لەبەر ئەوەی لەم فەرموودەیەی کەباسی دەکەیت، پێغەمبەری ئازیز (درودی خوای لەسەر بێت ) شان بەشانی هاوبەش

بڕیاردان بۆ خوای گەورە قەدەغەی سیحر وجادوو کردنی کردووە وبەیەکێك لەگەورەترین تاوانەکانی ژماردووە.

ئەوەش دەلیلە لەسەر خراپی گەورەیی تاوانی جادوو گەری، لەبەر ئەوەی کە جادووگەری بێباوەڕی بەخوای گەورە وزەر وزیان گەیاندن بە مرۆڤەکانی لەخۆیدا کۆکردۆتەوە وسەرەکی ترین کاری جادووگەران پاش سوکایەتی کردن بە پیرۆزیەکانی ئیسلام بەتایبەت قورئانی پیرۆز، زەرەر گەیاندنە بەغەیری خۆیان وئاژاوەنانەوە وتێکدانی پەیوەندی نێوان پیاو وژن وجیاکردنەوەیان لەیەك ورق وکینە دروست کردن لە نێوان هاوڕێیان ودۆستاندا وتووش کردنی مرۆڤی جادوو لێ کراو بەچەندەها نەخۆشی وئێش وئازار پاش ویستی خوای گەورە وچەندەها جۆری دیکە لەخراپی تاوانەکانی جادووی جادووگەران، جا لەبەر ئەوە پێویستە موسوڵمانان ئاگایان لەخۆیان بێت وەبەهیچ شێوەیەك نزیکی وەها کارانێك نەکەونەوە وخۆیان لەجادوو جادووگەران بەدوور بگرن بەتایبەت لەوانەی کەلەم زەمانەیەدا بانگەشەی زانینی شتە نادیارەکان وچاککردنەوەی نەخۆش وبەخشینی منداڵ ونوشتە کردن وخراپ وناشیرین کردنی پیاو وژن لەبەرچاو یەکتری وبڵاوکردنەوەی ڕق وکینە لەنێوان مرۆڤەکاندا....... وەچەندەها کاری نابەجێی دیکە کە هەموویان بەهاوکاری شەیتان وئەهریمەنەکان بەڕێوە دەچێت.

خوای گەورە لەگوناهی هەموو لایەکمان خۆش بێت ولەفێڵ وتەڵەکەی جاوگەران بمان پارێزێت ( اللهم آمین ).